

قانع خورشید

# گوڵبەهارێک

## لەم پاییزی عومرەمدا دەڕوێت





پرۆژەی بیری میانڕەو (٦٣)

# گوڵبەهارێك لەم پاییزی
# عومرەمدا دەڕوێت



قانع خورشید

ناوی کتێب: گوڵبەهارێک لەم پاییزی عومرەمدا دەڕوێت.
بابەت: کورتیلەچیرۆک
نووسەر: قانع خورشید (١٩٨٢ز-    )
دیزاینی بەرگ: ماج گرافیک
دیزاینی ناوەوە: ماج گرافیک
بڵاوکار: ڕێکخراوی هاوسانی و ناوەندی ڕێنوێن
نۆبەتی چاپ: یەکەم (٢٠٢١)
چاپ: ناوەندی ڕێنوێن
تیراژ: (١٠٠٠) دانە
نرخ: (٣٠٠٠) دینار
ئەندازەی لاپەڕە: (١٢×١٩,٥) سم
ژمارەی لاپەڕە: (١٣٦)
ژپنک (ISBN): ٩٧٨-٩٩٢٢-٦٢٦-٩٩-٤

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان، ژمارەی سپاردنی (١١١٦)ی ساڵی (٢٠٢١)ی پێ دراوە



هاوسانی
بۆ پەروەردە و مەعریفە


www.hawsani.org

Hawsani :: هاوسانی

facebook.com/miyanrewi

t.me/hawsani

باشووری کوردستان





ناوەندی ڕێنوێن

07701932749 - 07501269689

hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com


سلێمانی - بازاڕی ئاوباریک - نهۆمی یەکەم
بەرامبەر کاسۆمۆڵ - دوکانی ژمارە (٦٦)

پێشکەشە بەو گوڵە بەهارییەی درەنگی گەیشت و پاییزی تەمەنی کردمە وەرزی شکۆفە و خونچەکردن!





لەم زەمانی ناسوپاسییەدا، هەرچی سوپاس و ستایش هەیە بۆ تۆیە ئەی پەروەرێنی دانا و توانام و لەم ڕۆژگاری بێڕێزی و قەدرنەزانینەدا هەزاران دروود و سەلام بۆ سەر پێغەمبەر و یارانی بەوەفا و چاک و خانەوادەی باڵا و پاکی.

گێڕانەوە شێوە و قاڵبی زۆر و جۆراوجۆری هەن، لە ڕۆمان و چیرۆکی درێژ و نۆڤلێتەوە بیگرە تا دەگاتە چیرۆکەڵە یا تیرۆژەچیرۆک. هەریەک لەو شێوازانە هونەر و فۆرمی خۆی هەیە و ئەو شێوەیەیش، ئەمیان لەویان جیا دەکاتەوە. ئەڵبەت مەرج نییە گشت ڕۆمانەکان ڕێک یەک بن و هەموو کورتەچیرۆکەکان وێک بچن، وەلێ ئەوی هەیە ئەوەیە دواجار خاڵە سەرەکی و ڕیشەییەکانی هەر قاڵبێکی گێڕانەوە دەچنەوە سەر یەک و لە بنەماکانی قالبێکی تری جیا دەکاتەوە.

کورتیلەچیرۆک، هونەرێکی کۆنی نوێیە. کلیلە و دمنە شتی فرەی تیایە، لە چەندین ئایەتی قورئاندا -وەک ٢٥٩ی البقرة و ٢٦٦ی هەمان سوورەت- لە سێ-چوار دێڕدا داستان و بەسەرهات و ڕووداوی گرنگ و پڕمانا دەخوێنیتەوە. لە گوڵستانی شێخ سەعدیی شیرازی و فیە ما فیەی جەلالەدینی ڕۆمی

و زۆربەی شیعر و بەرهەمە عیرفانییەکاندا نموونەی زۆری وا بەرچاو دەکەون. تۆلستۆی دنیایەک وردە شتی وا جوانی هەس...

ئێستا شێوەیەکی تری کورتیلەچیرۆک پەیدا بووە، چەندوشەییە، یانی ئەوپەڕی دێڕێک یا دوو دێڕە. هەندێک کەسیش زێدەڕۆییان کردووە و چیرۆکەڵەی یەکوشەییان نووسیوە!

ئەم کورتیلەچیرۆکانە دەبێت وەها بن، خوێنەر خۆی وێنای زۆر شتیان لەپاڵدا بکات و مێشکی دنیایەک ڕووداوی تری شاراوە بۆ ناو بەسەرهاتەکە زیاد بکات، یانی ئەوەیان لەباردا بێت و سێبەریان وەها کشابێت، تۆی خوێنەر گورجێ بزانیت چیی تریان لەناو هەناودایە.

خوێنەر بۆ تێگەیشتن لەم جۆرەی چیرۆک، پێویستی بە زەینێکی ڕۆشن، بیرێکی تیژ، خەیاڵێکی ساف و وریاییەکی زۆر هەیە، هەندێکیان دوو-سێ مانا دەبەخشن، بڕێک لە ماناکان شتی ئاسایی و سادەن و هیچ قووڵییەکیان نییە، وەلێ کاتێک بە مانا و ڕوویەکی تر لێکیان دەدەیتەوە، پەی بە مانایەکی قووڵ و مەرگەساتێکی مەزن دەبەیت.

ئەوی ڕاستی بێت من لافی چیرۆکنووسی لێ نادەم و بڕوایش ناکەم لەم ژانرەدا سەرکەوتوو و لێزان بم و نیازیشم نییە کاری تێدا بکەم و خۆمی پێوە قاڵ بکەم، بە ئیشی خۆیشمی نازانم، بەڵام ئەلحەقی زۆر حەزم بە خوێندنەوەی چیرۆک و گێڕانەوەیە بە هەموو شێوەکانییەوە و تا پێم بکرێت، واز لە خوێندنەوەی

ئەدەبیات بەگشتی و چیرۆک و ڕۆمان بەتایبەتی ناهێنم.

لەگەڵ هاتنی پەتای کۆرۆنا و ڕاگەیاندنی قەدەغەی هاتوچۆدا، لەو ماوەیەی لە ماڵەوە بووم، دەرفەتی باشم بۆ رەخسا و بە دڵی خۆم کتێبم خوێندەوە، لەوانە: یەک دوو ڕۆمانی دۆستۆیڤسکی و هەموو بەرهەمە عەرەبییەکانی جوبران و سیدهارتای هێرمان هێسە و چەند شتێکی تر، ئیتر وا دەزانم بەهۆی ئەم کانیاوە ئەدەبی و مرۆییانەوە و کۆمەڵێک مانا دابارینە ناو مێشکمدا و لەخۆوە کەڵکەڵەی ئەوەم کەوتە سەرەوە لە قاڵبی کورتیلەچیرۆکدا دایانبڕێژم، ئیلهامی ئەم چیرۆکەلانە لە ماوەیەکی زۆر کەمدا بوو، ڕێک لە بیرمە یەکەم دانەیانم ڕۆژی ٢٠٢٠/٣/٢٦ نووسی و نەچووە دوو حەفتە نزیکەی هەموویانم تەواو کرد، دواتر چکی کرد و هیچی ترم بۆ نەهات.

ئەم کورتیلەچیرۆکانە، لە یەک ئاستدا نین، هەیانە کەمێک درێژ و هەیانە کورتترن. هەندێکیان ڕاچەڵەکێنترن و بڕێکیان سادەن... ئەوەی خوا ناردوویەتی ئەمانە بوون بە بێ زۆرلەخۆکردن. ئومێد دەکەم ئەگەر کەمێکیش بووە دڵ و مێشکی خوێنەر ڕابگرن.

جگە لە کورتیلەچیرۆکەکانی خۆم، چەند چیرۆکەڵەیەکی دانسقەیشم کورداندووە و بۆ زیاتر سوودمەندبوونی خوێنەران وەک پاشکۆیەک دامناون، بەو تێبینییەی ئەوانەی وەرمگێڕاون شێوەکەیان لەوانەی خۆم

جیاوازترن و لە جۆری یەکجار کورتەکانن.

ناوی نووسەرەکانیشم نووسیوە جگە لە کۆتا دانەیان کە دەزانم نووسەرەکەی ئێرانییە و لە چ کتێبێکدا بڵاو کراوەتەوە، وەلێ نە کتێبەکەم دەست کەوت و نە لە هیچ وارگەیەکیشدا ناوی نووسەرەکەی هاتبوو!

وا دەزانم بۆ هەمووان ڕوونە، کورتیلەچیرۆک خۆی بەتەنیا و بەسەریەکەوە بۆ خوێندنەوە خۆش نییە، دەبێت وەک هەوێنێک لێی بڕوانرێت و نووسینی تری پێ بمەیێنرێت یا وەک شەکر و خوێ و بەهارات سەیر بکرێت و بەهۆیەوە تام بدرێتە نووسین و وتاری پەروەردەیی و فیکریی تر.

خوا هەمووان بۆ چاکی و پاکی و جوانی ڕێنوێنی بکات و گشت لایە بباتە سەر حەق و خێردا.

قانع خورشید – صمود

١١/ ربيع الأول/ ١٤٤٢ ک

٢٨/ ئۆکتۆبەر/ ٢٠٢٠ ز

گوڵبەهارێک لەم پاییزی عومرەمدا دەڕوێت



١

## ئەزموون

درەنگی شەو هەواڵێکی خۆش لە میدیاکانەوە ڕاگەیێندرا، خەڵکی دەستیان بە تەقەی خۆشی کرد، ڕێژنەی گولەی گڕدار دەچوون بە ئاسماندا و بەناو کووچە و کۆڵاناندا دەکەوتنە خوارەوە. منداڵەکە هەر سەرەتاتکێی بوو و تامەزرۆ بوو بچێتە کۆڵان و لە ئاسمان بڕوانێت، باوکی نەیدەهێشت و دەیگوت گولەیەکی وێڵت بەر دەکەوێت، کوڕیچکە بە مەراقەوە لە ژووردا مایەوە. سبەی، لە دوای چێشتەنگاوی، کوڕە نیسی داگوتبوو «بۆچ نەتانهێشت شەوی بووری بچمە دەری؟ ئەوەتا ساغ و سەلیمم و هیچیشم لێ نەهاتووە»! باوکیشی کپ لە سووچێکی ماڵدا دانیشتبوو و بە سەری کزەوە ئەو فیشەکانەی دەژمارد کە سپێدە وەختێ بۆ دەستنوێژ چووبووە سەرئاو، لە حەوشەی ماڵدا دۆزیبوونییەوە!



گوڵبەهارێک لەم پاییزی عومرەمدا دەڕوێت

## ٢

# حەپەسان

گەنجەکە، وەک ئەوەی هەورەتریشقە لێی دابێت، بە چاوی زەق و دەمی داچەقاوەوە بە هاوڕێ زۆر لە خۆی گەورەترەکەی گوت: شتێکم دیوە، هەرگیز بە خەیاڵیشتدا نایەت. دوێنێ لەو دەشتەدا بە دوو چاوی خۆم دیتم، گوڵێکی جوان و بۆنخۆش لە تەپاڵەی مانگایەکدا ڕووابوو!

دۆستە کامڵەکەی بزەیەک کەوتە لالێوی و گوتی: نووری دیدەم، من لەوە سەیرترم دیوە، بەم دوو چاو و دوو گوێچکەیەکم دیومە و ژنەفتووم، کەسی لەو تەپاڵەیە پیستر، شیعری ناسکتر لەو گوڵە جوانانەی گوتوون!

٣

## دۆخ

مەلاییێکی دنیانەویست و خواپەرست، پێنج فەرزەی خوا لە مزگەوتدا پێشنوێژیی بۆ خەڵکی دەکرد، بێ لە جومعان، چەندین جاری تریش هەروا خوتبەی دەخوێند. لۆمەی ئەوانەی زۆر دەکرد وا بۆ دنیا و چەند هەزاریێ، لە بازاڕ و شوێنانی تر هەر ڕادەکەن، نایەن بۆ نوێژ و عیبادەت.

وەختێ مانگ گەیشتە کۆتایی و مووچەی ئیمام و خەتیبان کەمێ دواکەوت، دیقەتم دا جەنابی حاجی مامۆستا، چەندین نوێژان بە هەزار حاڵ بە ڕکاتی کۆتایی ڕادەگەشت!



۱۸

گوڵبەهاریک لەم پاییزی عومرەمدا دەڕوێت

٤

# ڕژدی

ئەوان هەم خزم بوون و هەم هاوڕێ. چەندین جار وەها ڕووی دەدا، ئەمیان شتێکی لێ زیاد بوو، دەیویست لە کۆڵی خۆیی کاتەوە، وەختێ نییەتی دەهێنا تووڕی هەڵدات، یا بۆ ناو گۆمێکی فڕێ بدات، ئەو دەیپرسی: ئەوە چییە؟ ئەم پێی دەگوت: فڵان شتە -دادەرێکی بێکەڵک و نەکارا، یا نینۆکبڕێکی بێسوود، یا قەڵەمێکی نوکشکاو، یا تەشیلەیەکی لاقۆزە...- ئەمیان تکای دەکرد بیدەرە من! ئەو دەیپرسی: تۆ بۆچیتە؟ کە وەڵامی وەها دەبوو: «کارم پێیە.» گورجێ لە گیرفانی دەنایەوە و بێباکانە دەیگوت: وەڵا خۆیشم ئیشم پێیە و ناتوانم بیدەم بە تۆ!

٥

## کوێری

بەرانبەر زۆر لە خزمان و دۆستانی، کەمتەرخەم و لە سەردان و چوون بۆ ماڵان، یەکجار تەڕاڵ و تەمبەڵ بوو، وەلێ زۆر جاریش ئەم گیانگرانییەی هۆکاری ڕاستەقینەی هەبوو. یەکێ لەو هۆکارانەی لای خزمانی باسی دەکرد: زۆریی سەردانکەر و میوان بوو.

زۆربەی ناسیاوانی گومانیان لە پاساوەکەی هەبوو. جارێک یەکێک لەو خزمانە بە حەوت - هەشت سەر خێزانەوە، بەمیوانی چوونە ماڵیان، لە گەرمەی دەمەتەقێدا بەسەرسامی و لاقرتێوە لە خاوەن ماڵەکەی پرسی: باشە ئێوە هەموو جارێ دێن و دەچن دەڵێن میوانمان فرەیە، کامەتانێ؟ کوا میوانتان؟!

## ٦

## خۆنەدیتن

پێنج برادەری تێگەییو و زانکۆدیتوو بوون، پێکەوە جادەیان دەپێوا و لە دەرێ پیاسەیان دەکرد. وەختێک چاویان بە حەشامەتی خەڵکی کەوت، بە یەکیان گوت: ئەو خەڵکە چەندە ناحاڵین! چەندە نابالغ و گێلن! چما ئاگایان لێ نییە لەبەر پەتا و مەترسیی تەشەنەکردنی، دەرچوون لە ماڵ ڕاگیراوە و دەوڵەت هاتوچۆی یاساغ کردووە؟!

## ٧

## چەشتن

دایکم، گۆڕی پڕ لە نوور و ڕووحی غەریقی ڕەحمەت بێت، چەند جار بۆی دەگێڕامەوە، دەیگوت: بە بیرم دێت، وەختێک دایکم بەنیاز بوو شتێک بدرووێت، پێی دەگوتم: «کافە! وەرە ئەو تیرەیەم بۆ بکە کونی ئەو دەرزییەوە!» منیش گاڵتەم لێ دەهات و پێیم دەگوت: چما دایە! ئەو کونە گەورەیە نابینیت؟ ئەویش دەیگوت ئینشائەڵڵا گەورە دەبیت و تێدەگهیئت. ئەنجا بزەیەکی تاڵی دەکرد و دەیگوت: قانە گیان، ئێستاکە تۆیش گاڵتەت لێ دێت یاوەکو نا، وەرە و تاڵێ تیرەم بۆ لە کونی دەرزییەک نێ!

## ٨

## غەفڵەت

یەک دوو مەلا و ئامۆژگاریکاری برەدەوە ماڵ، لە بەردەرگا پێیانی گوت: خێرتان دەگات کە هاتنە ماڵ، باسی فڵانە ڕەوشتی خراپ بکەن، ژنەکەم ئەو سیفەتەی تێدایە و ئومێدم هەیە قسەی ئێوە کاری تێ بکات. ئەوانیش گوتیان بەچاوان. کە چوونە ماڵ، سەری بابەتیان کردەوە و چەندی بڵێیت ئایەت و حەدیسیان بۆ خوێند، کە تەواو بوون، ژنە گوتی: بەو خودایە قسەکانتان یەکجار جوان بوون، خۆزگە ئەو ژنەی هاوسێمان لێرە بایە، خوا دەیزانێت ڕێک دەڵێیت باسی ئەوتان دەکرد!

# ڕواڵەت

بەخێرایی خۆی کرد بە دوکانی گۆشفرۆشییەکەدا و گوتی: زەحمەت نەبێت دە کیلۆ نەرمەی بەرخم بدەری! قەساوەکە بەهێمنی وەڵامی دایەوە: «ماشەڵا تۆ گەنجێکی قیتوقۆزیت، چەن دەقەیەک سەبرت هەبێت، با ئەم پیرەژنە بخەمە ڕێ، کیلۆیە ئیسقانی دەوێت، دوایی لە خزمەتتدام.» بەکزییەکەوە سەیرێکی ژنەی کرد و گوتی: «کێشە نییە، بەس کەمێک خێرا بە، منیش پەلەمە.»

دوای چوونی پیرەژنەکە، دە کیلۆ گۆشتەکەی کێشا و گورجێ ڕۆیشت، سواری لیکزسەکە بوو و خێرا ئاژووشتی. دوای سەعاتێک گەیشتە ماڵ، ژنەکەی بەگەشی هاتە پیرییەوە، چاکەتەی لێ وەرگرت و پەرداخێ ئاوی دایێ. بەتاسەوە ئاوەکەی هەڵقوڕاند و بە خێزانی گوت: بۆ نیوەڕۆ چیت لێ ناوە؟ ژنە گوتی: پەتاتەم کوڵاندووە، تەرەپیاز و نانی گەرمیشمان هەیە. پیاوەکە بە دەم بزەیەکی کاڵەوە گوتی: بمبوورە دوا کەوتم، کاتێک شتەکانم گەیاندە ماڵی گەورەم، پێی گوتم: «ئەگەر کێشەی تر نەیێتە پێش، مووچە لەمە زیاتر دوناکەوێت و مووچەی ئێوەی پاسەوان و شۆفێریش لە کۆتایی ئەم حەفتەدا دێت» جا ئەگەر هات، وەعدت دەدەمێ پێکەوە دەستی دوو منداڵەکەمان بگرین و بچین کەبابێکی خۆش بخۆین!

■

## داتەپین

خەریکی نامەگۆڕینەوە بوون، بە یارەکەی گوت: «ئاگات لێیە فەیسبوکی ئەو کوڕ و کچە هاک کراوە و حەیایان چووە؟ هەرچیی نامەی عاشقانەیان هەیە دەرکەوتووە، کێشەکە گەیشتووەتەماڵیان و دوور نییە بەڵایەکیان بەسەردا بێنن...» ئیتر چوونە تانوپۆی مەسەلەکەوە و دوو سەعات باسی ئەو کوڕ و کچە و کار و قسە خراپەکانیان دەکردن و لاقرتێیان پێ دەکردن، لەپڕ یارەکەی گوتی: درەنگە و وا بزانم پیاوەکەم بانگم دەکات، تۆیش بچۆ لای ژنەکەتەوە با لێت نەکەوێتە گومانەوە... کاتێکی تر تێرتێر قسەی دڵمان دەکەین!

## نواندن

دڵی پڕ بووبوو لە ڕق و قین، بەکوڵەوە دوعای دەکرد: «خوا ڕیشەی ئەم گەلە نەفام و نەخوێندەوارە لە بنەوە هەڵبکێشێت، ئاخر بۆچی دوای تێپەڕبوونی چەندین ساڵ لە چاپبوونی کتێبەکەم دەربارەی (لێبوردن و ئەوینداری)، هێشتا بیست نوسخەیشی لێ نەفرۆشراوە!»



گولبەهاریک لەم پاییزی عومرەمدا دەرویت

## لەخۆگۆڕان

لە نۆڕینگەکەی دانیشتبوو، پیرەمێردێکی چەماوە بەلەرزەلەرز هاتە ژووری، پزیشکەکە حەوسەڵەی وەڵامدانەوەی سەلامەکەیشی نەبوو، نابەدڵانە گوێی بۆ گرت و نەیهێڵا قسەکەی تەواو بکات، گوتی: «مامە گیان! بمبوورە؛ ڕاستییەکەی کاتم هێندە فرە نییە گوێ بۆ حیکایەتەکانت بگرم، ها ئەوە ناوی دەواکانتە، بیانکڕە و بەکاریان بهێنە.» ئەختیارەکە وەختێک هەڵسا، گوتی: «دختۆر! ماشەڵا هێشتا وەک خۆت ماویت، بگرە لەو کاتانەیش گەنجتریت وا گشت ڕۆژێک من خەریکی پاککردنەوەی مزگەوت بووم و ئەتۆ لە حەوشەکەیدا دەتخوێند، دەتگوت: حاجی گیان! دوعام بۆ بکە لە توب وەربگیرێم...»

## لێتێکچوون

منداڵەکان، هەموو خەونێکیان ئەوە بوو جارێکیش بێت لەگەڵ باوکیاندا نان بخۆن یا نیوسەعاتێ لەتەکیاندا یاری بکات، بەڵام باوکی داماویان لە کاتژمێر هەشتی بەیانییەوە دەچووە دەوام، لە دوو دەگەڕایەوە، لە پاش عەسریش دەڕۆیشت بۆ دوکان، نیوەشەوێ دەهاتەوە، هەموو هەوڵی بۆ ئەوە بوو، ئارەزووی منداڵەکانی بەدی بێنێت!

## شیعر

پەیتا پەیتا قاوەی دەخواردەوە، سەری خۆی دەوشارد و قژی خۆیشی ڕادەکێشا... هەرچی دەکرد شیعرێکی تازەی بۆ نەدەهات تا بیکاتە دواشیعری دیوانی بیست‌وپێنجەمی و سبەینێ بینێرێت بۆ چاپ... لە دوو کۆلانی ئەولایشیانەوە، شاعیرەکە دوو سەعات بوو چووبووە ناو جێگەی خەوەوە، هەرچەند خەیاڵی پەرت دەکرد، بۆ ئەوەی خەو بیباتەوە، خۆی دەغافلاند... کۆرپەی شیعرێکی تازە، ژانی بۆ هێنابوو و نەیدەهێڵا ئارام بگرێت و خەو بزێتە چاوانییەوە.

## خوشووع

لە نوێژ بوویەوە و سەلامی دایەوە، پیاوێکی بە شان و شەوکەت لە تەنیشتی بوو، بەهێواشییەکەوە گوتی: ببوورە، یەک دوو شتێک هەن حەز ئەکەم پێتیان بڵێم. گەنجەکەیش بە سەرسووڕماوییەوە گوتی: فەرموو، لە خزمەتتدام. کابرا دەنگی گڕتر کرد و گوتی: «گرنگترین شت لە نوێژدا ئەوەیە، ئاگات لە خۆت بێت و بێجگە لە نوێژ دڵت لای هیچی تر نەبێت، بەڵام تۆ هەنێ جووڵەی زیادەت هەبوون، بۆ نموونە نەدەبوو پەنجەی شایەتومانت وا ڕابگریت، لە کاتی چوون بۆ سوجدەیشدا نابێت شەرواڵت هەڵکێشیت، من ئەوکاتەی نوێژمان دەکرد ورد دیقەتی تۆم دابوو، ئەم شتانەت هەبوون، پێویستە چاکیان بکەیت و ئاگایانەتر و بە خوشووعی زیاترەوە نوێژ بخوێنیت»!

## باران

لە ڕێگە ئەوەندەی نەمابوو ئۆتۆمبێلێک خۆی بە ئۆتۆمبێلەکەیدا بکێشێت، بە بزەیەکەوە سەری لە جامەکە دەرهێنا و بە شۆفێرەکەی گوت: برای شیرینم، وریا بە، خوانەخواستە دەعمی دەکەیت.

بەر لەوەی بگاتە ماڵ، لە دوکانێک لایدا، دنیایەک میوە و شیرینیی کڕی.

زۆر برسیبوو، کە گەیشتە ماڵ و بینیی ژنەکەی هیچی لێ نەناوە، دایە قاقای پێکەنین و گوتی سەیر ئەو شانسە! دەمێکە وا برسی نەبووم، ڕاوەستن دەچم لەفە دەکڕم و گورجێ دێمەوە.

لە ڕێی بازاڕ سەری بۆ ئاسمان هەڵبڕی و گوتی: خوایە! ڕەحمەتت هەر وا بێتە خوار، اللهم صیباً نافعاً...

## چاکە

چارەکێک بوو لە کەناری ڕێگەکەوە سەیارەکەی ڕاگرتبوو، سەری خستبووە سەر سوکانەکەی و هەر دەگریا.

پێش چارەکێک کە هەزار دیناری دا بە منداڵە گوڵفرۆشەکەی سەر جادە، منداڵەکە گەزێک لە خۆشیاندا هەڵبەزی و ئەو مژدە خۆشەی بردە ئەودیوی جادەکە، تا بیگەیێنێتە خوشکەکەی!

## ڕاز

زۆر کەیفخۆش بوو، ئاخر هەر دوعایەکی دەکرد، گورجێ لای خوا گیرا دەبوو.

ئاگای نەبوو هەموو جارێ، دایکی لە پشتەوە دەوەستا و بەدڵ ئامینی بۆ دەکرد!





گوڵبەهارێک لەم پاییزی عومرەمدا دەڕوێت

## ڕووکەش

لەنێوان وانەی سێیەم و چوارەمدا بیری کەوتەوە نوێژی بەیانیی نەکردووە، بەرماڵێکی ڕاخست و دوو ڕکات نوێژی کرد.

هەر کە سەلامی دایەوە، مامۆستایەکی بەتەمەن لێی پرسی: مامۆستا گیان، ماشەڵا تۆ لە دیندا لە گشتمان شارەزاتریت، سوننەتی چێشتەنگاو چەند ڕکاتە؟

## عاشقبوون

بە دەم گوێگرتن لە ئاوازێکی کۆنەوە هەڵدەبەزی و لە شینایی ئاسمان ورد دەبوویەوە و بە تام و چێژێکی تایبەتەوە کولەبەڕۆژەی دەترووکاند، پێشتر قەت ئاوەها هەستی بەم گشت جوانی و خۆشییە نەکردبوو.

ئەو، یەکەم جاری بوو لە تەمەنیدا عاشق ببێت!

## شکست

کە لەسەر ڕێگە بینیی قالۆنجەیەک تلێقاوەتەوە، دڵی تەنگ بوو، کاتێکیش لە هەواڵەکان بیستی لە ئوستورالیا دوو کانگورۆ کەوتوونەتە گۆمێکەوە و خنکاون، دەستی کرد بە گریان...

ئەو زۆر نییە خۆشەویستەکەی مێردی بە کەسێکی دی کردووە.



## گومڕابوون

دوای خۆرئاوابوون، ٥٣یەمین سەردانکەری ئەو ڕۆژەی خستە ڕێ، جنۆکەی گیانی ٢٤یانی دەرکردبوو، دوعای چاووزاری بۆ ١٢ی تریان نووسیبوو، ڕەشکە و هەنگوینی بۆ ٦ی تریان دەستنیشان کردبوو، سیحری ١١ دانەکەی تریشیانی بەتاڵ کردبووەوە، جەمەدانێکەی لابرد و ئاوێکی بە سەروچاویدا کرد...

لە بەیانییەوە هەر بیری لای تۆرانی ژنەکەی بوو، لە دڵی خۆیدا لێکی دەدایەوە: «تۆ بڵێیت بۆچی حەفتەی پێشوو وا لەپڕ کردی بە شەڕ و تۆرا؟ ئایا جنێک چووەتە لەشییەوە یا ناحەزێک سیحر و جادوویەکی لێ کردووین؟!»

ئەوە حەوت ڕۆژە هەرچی دەکات ئەم پرسانەی پێ وەڵام نادرێنەوە!

## گەورەبوون

ئێستا ٣٨ ساڵ تەمەنمە، دوو ساڵە دەزانم منداڵ نیم.

ڕێک لەو ڕۆژەوەی دایکم مردووە...!

## کۆڵبەری

بیری لە ڕابوردووی دەکردەوە، خۆزگەی دەخواست لەو ٢٣ ساڵەی تەمەنیدا گوناهێکی وای کردبا بەهۆیەوە بچێتە دۆزەخەوە، تا هیچ نەبێت لەوێ گیانی گەرم بێتەوە.

دوای کەمێک، بەفرەکەی لە جەستەی تەکاند و کۆڵەکەی هەڵگرت و درێژەی بە کۆڵبەری دا!

##  کتێب

ئەوە بچووکەکەی کە ٧٤ ساڵیان بەین بوو، هاتە لای و دەستە زبر و چرچەکەی گرت و گوتی: «باپیرە، ئەوە بۆ تۆ قەت تووڕە نابیت و جنێو نادەیت؟ من دوو ساڵە لە مەکتەبم، گشت ڕۆژێ گشت هاوڕێکانم ئێژن بابا و دادامان دایمە لە ماڵەوە شەڕ دەفرۆشن!»

باپیرەی، چاویلکەکەی لەسەر چاوی لابرد و کتێبەکەی دەستی دانا و ماچێکی نێوچاوانی کرد...

## جوانی

هەر بیری دەکردەوە، تێنەدەگەیشت بۆچی لەپڕ کەشی دنیا وەها گۆڕا، خۆر وەک پێشتر تینی نەما، باپیرەی سەروریشسپیی قیتەوە بوو، باوکی دایە پێکەنین و دایکی بەتووڕەییەوە چوو، چۆلەکەکان بێدەنگ بوون و هەوریش دەستی بە بارین کرد! سەری لەوەیش دەرنەدەچوو بۆچی خۆیشی وا لەناکاو حەزی لێ بوو زوو گەورە بێت.

ئەو هێندە مناڵ و کاڵ بوو، نەیدەزانی وەختێ کیژێکی شۆخ ڕەت دەبێت، خودا نەخشەی هەموو دنیای بۆ دەگۆڕێت!

## تەنیایی

نووسەرەکە زۆر حەزی لە کپی بوو، هەرکات دەیویست تەنیا ببێت، تەنیایی لێی نەدەگەڕا!



## نووسین

کە خۆر هەڵدەهات، ئیتر ئەم هێدی هێدی بێتاقەت وماندوو دەبوو، لەگەڵ خۆرئاوادا بەئاگا دەهات و درەنگانێکی شەو چوست و چابوک دەبوو و دەستی بە کار دەکردەوە و خێرا و ئازا تێدەکۆشا.

لەوەتی من ئەوم ناسیوە، هەر وا بووە ئەم نووسەرە.



## سزای ویژدان

پزیشکەکە چووە ڕێستورانتێکی پلە یەک، لە کاتی خواردنی مەقلووبەدا، ئەو پارە زۆرەی دوێنێ لە نەخۆشە هەژارەکەی وەرگرت و بایی چارەکێکیشی گوێی لێ نەگرت، پەڕییە گەرووی، نانخواردنەکەی لێ شێواند!



گوڵبەهارێک لەم پاییزی عومرەمدا دەڕوێت

## بەهەشت

خەوتبووم، لە خەومدا چووبوومە بەهەشت، بۆنێکی یەکجار دڵڕفێن، دیمەنێکی بێحەد دڵگر، ئاوی زوڵاڵ، ئاسمانی ساف، چریکەی بولبول، شنەی فێنک... نەمدەزانی بە چی گەشتووم بەم مەقامە؟!

لە دەنگی بانگی سپێدەدا لە خەو ڕابووم، تەماشام کرد جێخەوەکەم لە خوار دۆشەکەکەی دایکمەوە ڕاخراوە، سەرم لەژێر پێیەکانی ئەو دانابوو.

## خۆکوژی

«ئاخ ئەگەر دەمزانی خۆشی و شادی و تۆڵەکردنەوە و پشوودان و ڕزگاربوون، تەنیا کاتێک مانایان هەس، خۆت زیندوو بیت... ئەگەر دوو خولەک پێشتر ئەم هەموو چارەیەم لە بیر دەبوون وا ئێستاکە دەیانزانم، هەرگیز هەڵەی وام نەدەکرد»

ئەمە دواقسەی ئەو گەنجە بوو وا لە داخی ئازارێکی گچکەی ژیاندا، خۆی کوشت!



## پیری

ڕۆژی بیست جار نییەتی دەهێنا بچێتە دەرەوە و پەشیمان دەبوویەوە، کونجی ماڵی بەرنەدەدا و حەوسەڵەی دەرەوەی نەبوو. هەمیشە لەبەر خۆیەوە دەیگوت: «بۆ منێک کە هاوڕێیەکم لە ژیاندا نەماوە، ماڵ و دەری هەر پڕپڕە لە تەنیایی و فەرقێکی وەهایان نییە بۆم.»

## دڵشکان

هەمیشە لە دژی هاوسەرگری دەوەستایەوە، لە گشت بۆنەیەکدا بۆ سەلماندنی خراپیی خێزان وتاری دەدا و هەر بۆ ئەم ئامانجەیش چەندین بابەت و کتێبی نووسیبوو، بەڵگەی ورد و سەیریشی دەهێنایەوە و قەناعەتی بە سەدان کەس هێنابوو.

تەنیا ئافرەتێکی پەنجا ساڵە هەبوو، دەرکی بە قسە و نووسینەکانی دەکرد و بە بیستن و خوێندنەوەیان دەگریا، هەموو جارێ ئاهێکی هەڵدەکێشا و خۆزگەی دەخواست، سی ساڵ بەر لە ئێستا باوکی ڕازی ببووایە و بیدایە پێی!





گوڵبەهارێک لەم پاییزی عومرەمدا دەڕوێت

## گرێ

هیچی وەکو پێشتر نەمابوو، گوتەی، کردەی، خواردن و خەوتن و جووڵەی...

سەر دەر ناکەم، بۆچی کاتێک پیاو ناتوانێت دڵی ئەو کچەی خۆشیدەوێت داگیر بکات، گۆڕانێکی وەهای بەسەردا دێت؟!



## باوک

شاعیرەکە، ساڵانێک بوو بیری لەوە دەکردەوە بۆچی هەمووان هەر باسی دایک دەکەن و کەسێک نییە لە ستایشی باوکدا، شاکارێک بەرهەم بهێنێت؟ ئەم خۆی پیاو بوو، باش دەیزانی قوربانیدانی باوکانیش جێگەی هەزار ستایشە. هەموو شەوێ بەم خەیاڵ و فیکرە پڕ و جەنجاڵەوە، درەنگانێکی شەو دەگەڕایەوە نێو ماڵێ...

هەموو جارێ وەختێک دەیویست بڕواتە ژووری خەوەکەی، بەسەر جێخەوی دایک و باوکیدا ڕەت دەبوو، شەو نەبوو لە ڕوخساری لە خەودانقومبووی داک و بابی نەڕوانێت و گشت جارێکیش، ماچێکی تەوێڵی دایکیی دەکرد، ئەنجا دەنووست!

## توانەوە

بـە دڵ و گیـان عاشـقی بـوو، هـەروەختێک بۆنـی وی دەهـات، یەکسـەر خـۆی بیـر دەکەوتـەوە!

# ناخ

حەکیمێک ئاوێنەیەکی سەیری دروست کرد، خستییە نێو چوارچێوەیەکەوە و بردییە گوندێک، پێی نەگوتن ئاوێنەیە، ئەوەیشی لێ شاردنەوە ئەم ئاوێنەیە وەهایە، هەرکەسێکی لێی بڕوانێت، حەقیقەتی خۆی تێدا دەبینێت، یا ڕاستتر بڵێم وێنەی ئەو کەسە یا ئەو شتەی تێدا بەرچاو دەکەوێت وا سەراپا گیان و بوونی داگرتووە. ئیتر دەیبردە لای هەرکەس، دەیگوتێ وێنەیەکم بۆ هێناویت، بزانە دەیناسیتەوە؟ دواتر ئاوێنەکەی لە بەردەمدا ڕاگرت و لێی دەپرسی: چ دەبینیت؟

لە بەرانبەر قەشەییێکدا ڕایگرت. گوتی: شەیتان دەبینم. خستیە بەرچاوی دایکێک، گوتی: ئەی بە قوربانیان بم، چۆن نایانناسمەوە، ئەوانە جگەرگۆشەکانمن! لە بەردەمی باوکێکدا داینا، گوتی: چی وا نییە، کەللەیەکی پڕ لە غەم و چۆڕێ عەرەقەی نێوچاوانە! بەرپرسێکی دەسەڵاتدار هەر کە دیتی، تفێکی کردێ و گوتی: ئەم سەگە گەڕە ئەوە دێنێت بخرێتە نێو تابلۆیەکی ئاوەها ڕێک و جوانەوە؟!

وەختێکیش خستیە بەر دیدی عاشقێکی سووتاوەوە... چاوانی پڕ بوون لە فرمێسک، بزەیەک هاتە سەر لێوی، گوتی: توخوا ڕاستی بڵێ، تۆ چۆن یاری منت ناسیوە و لە کوێ ئەو وێنە جوانەیەت لێ گرتووە؟!

## بێخەوی

شەو و ڕۆژێک بوو نەخەوتبوو، لە گیانی خۆی جاڕز بووبوو... ژنەکەی تەرمی کۆرپەکەی لە باوەش گرتبوو، بەسەریا خەریکی شین و شەپۆڕ بوو، لەنێو حەوشەوە دەنگی زیقە زیقێکی گوێکەڕکەر دەهات، دوو منداڵە حەوت و چوار ساڵانەکەی بەربووبوونە گیانی یەک و خەریکبوون یەکیان دەخنکاند...

لەناو ئەم دۆزەخەدا خەو بەسەریدا زاڵ بوو و بۆ چارەکێک چاوی چووە خەو، خەوێکی زۆر شیرین و ئارامبەخش.

کە لە خەو ڕابوو، سەیری کرد هاوسەرەکەی لەپاڵیدا کۆرپەکەیان دەڕاژێنێ و بە دەنگێکی دلگر و خۆش لایلایەی لەبۆ دەخوێنێت... لە حەوشەوە دەنگی چۆلەکە و بولبول دێت و دوو منداڵە حەوت و چوار ساڵانەکەیشی خەریکی یاریی گورگ و مەڕن و لە خۆشیاندا هەڵدەپەڕن!

## دژیەکی

ئەو بۆیە وازی لە نووسین هێنا، چون سێ ساڵی ڕێک هەوڵی دا یەکەم کتێبی چاپ ببێت، وەلێ هیچ ناوەند و ڕێکخراو و خانەی وەشانێک بۆیان چاپ نەکرد.

کتێبێکی گرنگ و پڕزانیارییش بوو، بەدڵخۆشییەوە ناوێکی سەرنجڕاکێشی بۆ هەڵبژاردبوو: (هەرگیز کۆڵ مەدە)!



## بەمرۆڤبوون

بە دەنگێکی کزەوە دەیگوت، ڕۆیشت، تازە ڕۆیشت... هیچ سەرکێشییەکم وەکو جاران نەماوە، پیری تڕکی هەموو شتێکی ئادەمیزاد هەڵدەپاچێت و خووەکانی پاک دەکاتەوە ئینسانی!

## چاوبەست

قالۆنجەیەک شیاکەی تل دەدا، دوو سیسرکە هاتنە سەر ڕێی، سەری قسەیان کردەوە، هاتنە ویزەی مرۆڤ و خراپەکانیدا، قالۆنجەیان باش تێگەیاند کە ئەم گیاندارە سەیرە، شتە پاکەکانیشی پیسە، جا چ بگا بە پیسییەکەی! قالۆنجە هێڵنجێکی دا، خێرا شیاکەی جێهێشت و بەپەلە چوو... دوای چەن خولەک، هەردوو سیسرکەی دانا و دڵسۆز بەکەیفێکی بێوێنەوە سەریان خستە نێو پیسایی و تێری زگی خۆیان لێ خوارد!



گوڵبەهارێک لەم پاییزی عومرەمدا دەڕوێت

## گەورەیی

لە منداڵییەوە ئاواتی بوو ببێتە نووسەر، کە گەورە بوو ڕەوتی ژیانی جۆرێ نەبوو، ئاواتەکەی بۆ وەدی بێت... وەلێ کە مرد، باسوخواسی ژین و خەبات و کارەکانی، بوونە ئیلهامی سەدان شیعر و بابەتی دەیان چیرۆک و مادەی چەندین ڕۆمان و توێژینەوەی مەزن!



گوڵبەهارێک لەم پاییزی عومرەمدا دەڕوێت

## ژاکان

هەرچەن کۆشای نەیتوانی لەسەر کورسییەکەی هەڵبسێت، چەند خولەکێک لەپەکوتێی کرد و چاویلکەکەی نەدیتەوە، بە کزییەکەوە بانگی نەوەکەی کرد: «پەروانە گیان، دەزانیت عەینەکەکەی باپیرە لە کوێیە؟ بۆمی بێنە و دەستم بگرە با هەڵبسمەوە!»

پەروانە پڕی دایێ و باپیرەی کەنەفتی هەستاند

دواتر گوتی: «ها باپیرە، ئەوە عەینەکەکەتە. هەم دەتەوێت سەیری مەدالیا و خەڵاتە وەرزشییەکانی جارانت بکەیتەوە؟ ئەمڕۆ ئەمە دەیەم جارە سەیریان دەکەیت!»



گوڵبەهارێک لەم پاییزی عومرەمدا دەڕوێت

## دەریا

موریدێک بە پیرێکی خنکاوی نێو ئەوینی گوت: «خۆتم دەوێت، تخوا درێغیم لێ مەکە!»

پیر، گرنژی و ئەو کاتانەی بیر کەوتەوە وا تازە بووبووە ماسیگر، ئەوکات ئەمیش شارەزای سروشتی دەریا نەبوو، بۆیە بەدڵ دوعای دەکرد: «ماسی لە دەریا نەبڕێت و ئەم بەشی خۆیی لێ ببات.»

## ڕابوردوو

کە گەیشتبووە پەنجاساڵی، دەفتەری یادگارییەکانی لە سی دەفتەری دووسەدلاپەڕەیی تێپەڕیبوون.

هەموو شەوێک دەفتەرێکیانی دەردەهێنا و پاش موتاڵا و خوێندنەوەی چەندین لاپەڕەی و دڵتەنگبوونی، یەک پەڕەی لێ دەدڕی و دوای وردوردکردنی، دەیسووتاند.

ئەو چەند ساڵ دەبێت بڕیاری داوە یادگارییەکانی بدڕێت و چیدی بەدیار ڕابوردووەوە تەمەنی خۆی بە با نەدا!



## مەرگ

دوو چۆلەکە لەسەر لقەدارێک نیشتنەوە، نێرەکە بە مێیەکەی گوت: «وەرە ببە بە جووتی من، وەعد دەدەم لە ئارامترین پاساردا هێلانەیەکت بۆ ساز کەم، وەک بێچووەکانمان، خۆراک دەکەم بە دەمی تۆیشەوە، هەرچیت بوێت، بۆتی دێنم، کرم و کولە، یا پەپوولە... دڵنیا بە لە پەنای مندا خۆشبەخت دەبیت، گەر بزانیت چەند بەهێزم، بێ دوودڵی ڕازی دەبیت، دنیایەک ئەزموونم هەیە، نیوەی ئاسمانم تەی کردووە و باکم بە هیچ ترسێک نییە...»

هێشتا تەواو گەرم نەبووبوو و باسی مەزنایەتیی خۆی تەواو نەکردبوو، منداڵێکی چەتوون بە دارلاستیکێکەوە نیشانەی لێ گرت، بە سێ چرکە سەری نێرەی خۆهەڵکێشی فرەوێژی بە بەردێکی غل و لووس، پەڕاندە بیست مەتر ئەولا!

## زانایی

کابرایەکی نەفام بەتووڕەییەوە ڕووی دەمی کردە زانایەک: «ئادەی پێم بڵێ: بۆچی هەرگیز هیچ زانایێک لە وەڵامی هیچ پرسیارێکدا ناڵێت (نازانم)؟»

کابرای زانا بزەییێکی کرد و گوتی: «ئەوەی ڕاستی بێت... نازانم!»



## درۆ

خۆنەناسێک لەنێو کۆڕدا بەوپەڕی متمانەبەخۆبوونەوە باسی ئەوەی دەکرد، پیاوی ڕاستگۆ باکی بە ڕای ئەوانی دیکە نییە و هێندە بڕوای بە خۆیەتی، پەنا بۆ فڕ و فێڵ نابات، هەوڵیش نادات بەزۆر قەناعەت بەوانی دی بێنێت، دواتر پڕ بە گەرووی هاواری کرد: «قەسەم بە خوا، بۆ هیچ شتێک لە عومرمدا هەرگیز سوێندم نەخواردووە!»



گولبەهاریک لەم پاییزی عومرەمدا دەرویت

## ڕەشبینی

کوڕە ڕەشبینەکە چووە داوای ئەو کچەی وا سێ ساڵە ئەویندارێتی، کە هاتەوە، لە ژوورەکەی خۆیدا لەسەر پشت ڕاکشا...

گوێی لە دەنگی پانکەکە گرت کە بەخاوی ئیشی دەکرد، وەختێک بەوردی گوێچکەی داین، دەنگی سووڕانی پانکەکە دەیگوت: «نایدەن، نایدەن، نایدەن!»

## فەرامۆشی

لەسەر سفرە بەبێزاری و تووڕەییەوە دانیشتبوو، قاپی شلەکەی ئەم لە هیی ئەوانی دی گۆشتی کەمتر تێدا بوو، بیری لەوە دەکردەوە «چۆن وا دەبێت؟ ئاخر ئەوی مردووە و ئەمان نانی پرسەکەی دەخۆن، دۆستی گیانیی ئەم بوو و ئەوانی تری زۆر نەدەناسی»!

## وەهم

پێنج منداڵ گوێیان لە تەقەتەقی دێوێک بوو کە لە ژوورە بنینەوە دەنگی دەهات، وەخت بوو زیرە بکەن، لەپڕ منداڵە چەتوونەکەی هاوسێیان هاتە لایان، ویستیان بیدەنە دەستی دێوەکان و لە دەستی ڕزگاریان ببێت، گوتیان: «بڕۆرە ئەو ژوورەوە، مشکێکی تیایە، ئەگەر توانیت بیکوژیت، هاوڕێتیت دەکەین.» ئەو چووە ژوورەوە و ئەوان ڕایان کرد.

دوای پێنج خولەک لە زرمە زرم، کوڕە هاتە دەرەوە و مشکێکی تۆپێنراوی بە کلک هەڵگرتبوو!

## ژن

کوڕیچکەکە بەکەیفەوە گوتی: «ئەڵڵا چەن خۆشە کوڕم و کچ نیم!»

دایکی پرسیی: «بۆچی ڕۆڵە گیان؟»

ئەویش گوتی: «ئەی بۆ ئەوەی کە گەورە بووم، وەک تۆ ئەو گشت ئیشە ناکەم، وەک باوکم بۆ خۆم هەر ڕادەکشێم و سەیری تەلەفریۆن دەکەم!»

## پووچی

جارێکیان ڕێوییەکی گەڕ ڕێ هەڵە دەکات و بە نیازی پەیداکردنی پلە گۆشتێکی گەنیو دەچێتە بێشەی گەلەشێریکەوە، لەوێ شێرەکان پەلاماری دەدەن و دەوری دەتەنن، ئەمیش ناچار دەست دەکاتە زیقە و نووزە و نرکە و ناڵە، ئیتر هەرچیی ڕێوی و کەمتیاری ئەو ناوە هەن هەوڵ دەدەن بگەنە فریای و قوتاری بکەن...

لەنێو زەلکاوێکی ئەو نزیکانەدا هەندێک بۆق و قالۆنجە و مێروویش دەنگ هەڵدەبڕن و دەڵێن «ئێمەیش پشتیوانتین ئەی ڕێویی مەزن»!

بۆ فرۆشتن: پێڵاوی منداڵ، هێشتا لەپێ نەکراوە.

ئێرنست هێمینگوای

هیچ هۆشم نەبوو، دوو پیاڵەم تێکرد!

ئالیستر دانیال

بەخاکسپاردنەکە تەواو بوو. هەوڵی دا خۆی کورسییە تایەدارەکەی بڕانێت!

جەعفەری جاسمی نەژاد



گوڵبەهارێک لەم پاییزی عومرەمدا دەڕوێت

زیندانییەکە کلیلەکەی لە کەمەری پاسەوانەکە کردەوە و قووتی دا.

سەیید محەمەدی حسێنی

پیاوەکە هێمن دەخەوت، ژنە هەموو شەوێک لە ڕۆمانەکە دەهاتە دەرەوە بۆ لای!

مریەمی ئارامش



١٣٠

گوڵبەهارێک لەم پاییزی عومرەمدا دەڕوێت

بە سەرقۆڵەکەی عەرەقی نێوچاوانی سڕی و گوتی:
کاتێک گەورەیش ببین، هەر دەبێت هێندە کار بکەین؟!

نەناسراو

(لە کتێبی «شازدە کوچولو در مترو»دوە)

## کتێبە چاپکراوەکانی بزوتنەوەی بیری میانڕەو

١. ئەرکی ئەمڕۆی گەنجی موسوڵمان.

ن: یووسف قەرەزاوی. و: شڤان ئیبراهیم.

٢. ئایین لە سەردەمی زانستدا.

ن: یووسف قەرەزاوی. و: محەمەدی مەلا حەسەن.

٣. ئەو ئیسلامەی بانگەوازی بۆ دەکەین.

ن: یووسف قەرەزاوی. و: شڤان ئیبراهیم.

٤. ئافرەتانێکی باوەڕدار.

ن: یووسف قەرەزاوی. و: ڕووبار عومەر ئیبراهیم.

٥. بوونی خوا.

ن: یووسف قەرەزاوی. و: حەسەن پێنجوێنی.

٦. یەکتاپەرستی.

ن: یووسف قەرەزاوی. و: سالار عەبدورڕەحمان.

٧. موسوڵمانان و جیهانگیری.

ن: یووسف قەرەزاوی. و: سەرکەوت جەلیل.

٨. قسەگەلێک لەمەڕ میانڕەویی ئیسلامی.

ن: یووسف قەرەزاوی. و: هیوا مەحموود جاف.

٩. ڕۆڵی قەرەزاوی لە چەسپاندنی میانڕەویی ئیسلامیدا.

ن: ئەکرەم کەساب. و: هیوا مەحموود جاف.

١٠. چارەسەری ئیسلام بۆ گرفتی هەژاری.

ن: یووسف قەرەزاوی. و: حەمەکەریم عەبدوڵلا.

**١١. زانایەک و ستەمکارێک.**

ن: یووسف قەرمزاوی. و: ئیحسان بورهانەدین.

**١٢. ڕۆشنبیریی بانگخواز.**

ن: یووسف قەرمزاوی. و: هێمن خورشید.

**١٣. نەوەی سەرکەوتن.**

ن: یووسف قەرمزاوی. و: یووسف مەلا خەلیل.

**١٤. سیستەمی ستەمکاری، سەرهەڵدان و ڕووخانی.**

ن: قانع خورشید.

١٥. مرۆڤ و پەیامداری.

ن: قانع خورشید

١٦. مێژووی شێوێنراومان.

ن: یووسف قەرمزاوی. و: ئیکرام کەریم.

١٧. هۆکارەکانی سەرکەوتنی ڕەوتی ئیسلامیی میانڕەو.

ن: عومەر عەبدولعەزیز.

١٨. ئاو و ئاور.

ن: هێمن خورشید.

١٩. ئایین و هەرا.

ن: عومەر عەلی غەفوور.

٢٠. حەسەن بەننا ڕابەری بێداری.

ن: هیوا مەحموود.

٢١. قومێک ئاوی سارد بۆ گەروویەکی تینوو.

ن: قانع خورشید.

٢٢. سەلەفییەت، واتا و مێژوو.

ن: قانع خورشید.

٢٣. وەهابییەت، وتارێکی ڕەخنەیی.

ن: حامد ئەلگار. و: سەیوان عەلی.

٢٤. پەیکەر و وێنە لەنێوان دەق و واقیعدا.

ن: ڕێناس ئەحمەد.

٢٥. ئەڤین، تەنیا بیانووی ژین.

ن: قانع خورشید.

٢٦. فووکردن لە خۆڵەمێش.

ن: هێمن خورشید.

٢٧. بۆچی ئیسلام؟

ن: یووسف قەرەزاوی. و: ڕووبار عومەر ئیبراهیم.

٢٨. عیشق لەنێوان عەقڵ و ئاییندا.

ن: قانع خورشید.

٢٩. ئایا موسوڵمانان دەبنە حەفتاوسێ بەشەوە؟

ن: حاکم موتەیری، سەیید حەسەن سەقاف. و: یووسف مەلا خەلیل.

٣٠. بەخشینی نرخ (قیمەت) لە زەکات و سەرفیترەدا.

ن: یووسف قەرەزاوی. و: قانع خورشید.

٣١. مەلای گەورە، کوێخای دیوەخانی هزر و میوانی دیوانی شیعر.

ن: قانع خورشید.

٣٢. مرۆڤ و باوەڕ.

ن: مورتەزا موتەههەری. و: ئارام سەلاح.

٣٣. بەردبارانکردنی زیناکەر لە قورئاندا نییە.

ن: موستەفا زەلمی. و: شڤان ئیبراهیم.

٣٤. ئەڤین، تنێ حێجەتا ژینێ.

ن: قانع خورشید. و: ئەیاز عەبدوڵڵا مزرووری.

٣٥. بۆ ئەو گەنجانەی دەچنە زانکۆ.

ن: قانع خورشید.

٣٦. دیاردەی هەڵگەڕانەوە لە دین.

ن: قانع خورشید، ڕێناس ئەحمەد.

٣٧. بۆ ئەوانەی وەکو خۆمن.

ن: قانع خورشید.

٣٨. سوننەت و بیدعەت.

ن: یووسف قەرەزاوی. و: محەمەدی مەلا حەسەن.

٣٩. تێرامانێک لە چەمکی بیدعەت.

ن: محەمەد مەلا مەحموود تاوگۆزی، یووسف مەلا خەلیل.

٤٠. گرفتەکە لە کوێدایە؟

ن: یووسف قەرەزاوی. و: ئەحمەد حسێن.

٤١. ئایین و ناتوندوتیژی.

ن: عومەر عەلی غەفوور.

٤٢. بۆ ئەوانەی وەکو خۆمن (٢).

ن: قانع خورشید.

٤٣. دیوەکەی تری جەلالەدین.

ن: قانع خورشید.

٤٤. ئەبووحامدی غەززالی و تێڕوانینی بۆ زانستی کەلام.

ن: قانع خورشید. و: عەلی حسێن.

٤٥. سەدەیەک گەڕانەوە بۆ قووڵایی مێژوو.

ن: ئەمجەد شاکەلی.

٤٦. گۆڕهەڵکەنەکان، ئەو ژیلەی گۆڕ بۆ مرۆڤایەتی هەڵدەکەنێت.

ن: ڕۆژی گاروودی. و: ئەحمەد حسێن.

٤٧. لە شامەوە بۆ شیراز.

ن: قانع خورشید.

٤٨. تیرۆری فیکری.

ن: یووسف قەرەزاوی. و: میران مەجید.

٤٩. ئاریشەکانی ئەوین.

ن: مستەفا مەحموود. و: سەرمەد ئەمیر.

٥٠. بۆ ئەوانەی وەکو خۆمن (٣).

ن: قانع خورشید.

**٥١. فیقهی ڕۆژوو.**

ن: یووسف قەرەزاوی. و: یووسف مەلا خەلیل.

**٥٢. خوێندنەوەیەکی سۆفیگەری و تەریقەتی نەقشبەندی.**

ن: ئەمجەد شاکەلی.

**٥٣. کتێبێک بانتر لە خەیاڵ.**

ن: محەمەد سەعید ڕەمەزان بووتی. و: میران مەجید، محەمەد شافیعی.

**٥٤. باسوخواسی بەندایەتی و ئەویندارى.**

ن: عەبدولکەریم سرووش. و: عەلی حسێن.

**٥٥. گەڕان بە دوای مانادا.**

ن: ترینا پۆڵەس. و: قانع خورشید، هاروون ماهووتی.

**٥٦. هونەری سادەنووسی و جواننووسی.**

ن: ڕەزا بابایی. و: عەلی حسێن.

٥٧. زێدەڕۆیی لە ئاییندا، هۆکار و چارەسەر.

ن: عومەر عەبدولعەزیز. و: هلوکار قادر خانەقایی.

٥٨. نووری بوونت لە ئاوێنەی گشت هەبوویەکدا دەبینم!

ن: قانع خورشید.

٥٩. لەبارەی تەنیاییەوە.

ن: قانع خورشید.

٦٠. زمانی کوردی، پێویستیی پاراستنی، مەترسیی هەڵوەشانەوەی،

ن: عەلی حسێن.

٦١. ئاوڕدانەوەیەک لە ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵاتناسی،

ن: ئەمجەد شاکەلی.

**٦٢. پێگەی فەرمووده لەنێوان یار و نەیارانیدا،**

ن: ئەحمەد ئیبن یووسف ئەلسەیید، و. میران مەجید.

**٦٣. گوڵبەهارێک لەم پاییزی عومرەمدا دەڕوێت،**

ن: قانع خورشید.

ئەوی ڕاستی بێت من لافی چیرۆکنووسی لێ نادەم و بڕوایش ناکەم لەم ژانرەدا سەرکەوتوو و لێزان بم و نیازیشم نییە کاری تێدا بکەم و خۆمی پێوە قاڵ بکەم، بە نیشی خۆیشمی نازانم، بەڵام ئەلحەقی زۆر حەزم بە خوێندنەوەی چیرۆک و گێڕانەوەیە بە هەموو شێوەکانییەوە و تا پێم بکرێت، واز لە خوێندنەوەی ئەدەبیات بەگشتی و چیرۆک و ڕۆمان بەتایبەتی ناهێنم.





٣٠٠٠ دینار

ISBN:978_9922_626_99_4

